# حیکمەتەکانی پەیامبەر موحەمەد
# و
# شتێك دەربارەی ئیسلام

نووسینی فەیلەسوف
لیۆ تۆلستۆی
وەرگێرانی لە عەرەبییەوە
پارێزەر/ یونس الراوی

محمد ﷺ

ناوی کتێب: حیکمەتەکانی پەیامبەر موحەمەدو شتێك دەربارەی ئیسلام
نووسینی: فەیلەسوف لیۆ تۆلستۆی
وەرگێڕانی: پارێزەر یونس الراوی
نەخشەسازی ناوەوە: محمد علی احمد
ساڵی چاپ: ٢٠١٠ ز
شوێنی چاپ: بەیروت ـ لوبنان
ژمارەی سپاردن: (١٤٠٠)ی ساڵی (٢٠١٠)ی بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی پێدراوە.

# حیکمەتەکانی پەیامبەر موحەمەد

## و

## شتێك دەربارەی ئیسلام

## نووسینی فەیلەسوف

لیۆ تۆڵستۆی

## وەرگێرانی لە عەرەبیەوە

پارێزەر/ یونس الراوی

## پێشکەشە بە:

*ڕۆحە فریشتەکەی (مامۆستا مەلا سەید حەمەدەمین گەزنەیی)، ئەو مرۆڤەی فێری ئایین و ژیانی کردم.
*سەرجەم خوێنەرانی (لیۆ تۆڵستۆی) و حەق و حەقیقەت.
*ئەوانەی دان دەنێن بەوەی کە پەیامبەر موحەمەد گەورەترین مرۆڤی مرۆڤایەتی و وجوودە.

## ووشەیەك لە وەرگێڕی ڕووسی

پیاوی مەزن ڕێزی پیاوی مەزن دەگرێت خوێنەرانی زمانی عەرەبی ئاشنان کەوا فەیلەسووف (کۆنت لیو تۆلستۆی) ڕۆماننوس وچیرۆکنوس

ورەخنەگر چاونەترس و دلێرو بەرگریکارە لە حەق و حەقیقەت بەبێ ئەوەی ترسی لۆمەی لۆمەکاران هەبێت تا ئەو ئەندازەی ڕەخنەی لە قەیسەری ڕووسی و پیاوانی حکومەتی دەکرد دەربارەی پێداویستی و گرفتی هاولاتیان و کەم و کوڕی کەلێی بێئاگان.

چاودێرانی سیستەمی رووسیای ئەحکامە ڕەهاکانی ئەم وولات تەنیا سەرسامی ئەم قارەمانیە ئەدەبیەن و نەترسانی لەم دەسەلاتە رەهایانە.

تۆلستۆی کارو کردەوەی ڕێکخراو کۆمەلانی مزگێنیدەری مەسیحی لە (قازان ) دەبینی چۆن کردەوە گەلێ دەخەنە پالێ ئیسلام و پەیامبەری ئیسلام کەپێچەوانەی ئەو ڕاستی و دروستیانەیە کەلە ئیسلام و پەیامبەردا هەیە بۆیە غیرەتی حەق و

حەقیقەت دەجولێنێ کەپیامێك بنوسێت تیایدا چەند فەرمودەیەکی پەیامبەر موحەمەد (درودی خوای لێبێت)ی هەلبژارد و قسەی لەسەر کرد پاش دەستپێکێکی شکۆمەند و روون و ئاشکرا بەبەلگاندنەوە.

وتی: ئەمانە فێرگەکانی خاوەنی شەریعەتی ئیسلامە، کەخۆی دەنوێنێ لە حیکایەتگەرێکی بالآو ئامۆژگاری بەهادار، و مرۆڤ رێنمای رێگای راست ودروست دەکات.

هیچ شتێك دەربارەی فێرگەکانی ئاینی مەسیحیەت کەم ناکاتەوە و بەلێنی دا کەوا پەرتوکێکی گەورە بنوسێت و تیایدا زیاتر لێکۆلینەوە بکات وزیاتر فراوانتر بکات لەژێر ناونیشانی ( موحەمەد ).

کاتێك خوێندنەوەیەکم بۆ ئەم پەیامە کرد سەرسام بووم بە حەقیقەت و راستە سەر بلندانە، وئەم مەبەستە پاك ودروستانەی تۆلستۆی.

حەق پالنەری سەرەکیم بوو بۆ وەرگێرانی لەزمانی رووسی کەزمانی فەیلەسووف تۆلستۆیە بۆ سەر زمانی عەرەبی تووشی زۆر گرفت و ماندوو بوون هاتم لەم وەرگێرانە کەوا گەرانەوەی

فەرموودەکان بۆسەر تێکستە رەچەڵە عەرەبیەکەی کەتۆلستۆی کاری تیادا کردووە.

هیواخوازم ئەم کارە خزمەتێك بەسەرجەم موسولمانان ببەخشێ و ئەم دیاریە پێشکەش بەرۆژهەلاتیەکانی دەکەم بەگشتی و ئەوەش دوا ووشەمە.

وەرگێری ڕووسی

سلیم قبعین

## " پێشەکی وەرگێری عەرەبی "

ستایش بۆ ئەڵلا، ستایشێك شان لەشانی نازەکانی، سوپاسگوزاری سەرجەم بەخششەکانت دەکەم کە نایێتە ژماردن، کرنۆشت بۆ دەکەم لەسەر ئەوەی کە منت لە عەدەم هێناوەتە وجوود، بەردەوام گوناهەکانم بۆت بەرز دەکرێتەوە کەچی بەردەوام نازو نیعمەتەکانت بۆم دادەبەزێت،سوێند بە گەورەیی و مەزنی تۆ تەنیا تۆ شایەن وشایستەی پەرستش کردنی، ئەی پەروەرگار تۆ گوڵ و ئاسك و بەهار و پێکەنین و کانیاوەکانت ئافراندووە، هەموو شتەکان بەڵگەن کە تۆ خودایەکی تاك و تەنیایی، منم کە داوا لەکەس ناکەم جگە لە تۆ نەبێت، چونکە بەداواکاری لەلای خەڵك قێزەون وەلێ بە داوایی لەتۆ خۆشەویست دەبم لەلات.

وادەبینم گوناهەکان هاژووشتی دۆزەخم دەکەن، وەلێ کە ئاوڕی بەزەیی و دلۆڤانیت دەدەمەوە تەنها بەخششێك بەهەشت دەبینم لە گەورەی تۆ بوەشێتەوە لەوەی کە سزام بدەییت.

خوداوەندا زمانم ناتوانێت گوزارەشت لە مەزن میهرەبانیت بکات، بەلاّم داواکارم لە نووری تەجەللات کە پێنووسەکەم جێگیر بکەییت بۆ نوسراوکردنی حەق و حەقیقەت، و ئاشتی و ئارامی

بەخششی بەندەکانت بدەی لەسەر زەوی ئەگەر سزایان بدەییت ئەوان بەندەی تۆن، و ئەگەر بیانبەخشیت ئەوا تۆ لێبووردە و بەزەیی.

سەڵات و سەلامی ئەللاّ لەسەر گیانی پەیامبەر موحەمەد، ئەو مرۆڤەی لەکاتێ ئاوی زەریا و دەریاکان تاڵ بوون بە تەڕایی لێوەکانی ئاوەکان وەکو هەنگوینیان لێهات، ئەو مرۆڤەی بت پەرستانی کرد بە یەکتاپەرستان، ئەو مرۆڤەی عەقڵ و دڵ و گوێیەکان و چاوەکانی مرۆڤەکانی کردەوە.ئەو پیاوەی ئەللاّ پێیووت: (بەڕاستی تۆ لەسەر رەوشتێکی بەرزییت).

مایکل هارس لە کتێبە جیهانیەکەی (سەد مرۆڤە مەزنەکە) کە پەیامبەری ئیسلامی بە یەکەم مرۆڤی مرۆڤ دۆست و مرۆ ڤایەتی ناوزەند کردووە دەڵێت: (من کە مەسیحیم دەشزانم زۆرێك لە مەسیحەکان لێم زوویر دەبن، بەڵام حەق و حەقیقەت موحەمەد گەورەترین مرۆڤە کە ناسیبێتم).

وێل دیۆرانت لە (چیرۆکی شارستانی) دەڵێت: (پەیامبەری ئیسلام مەزنترین مەزنەکانی مێژووە).

خوێنەری بەڕێز ئەو کتێبەی بەردەستت ماندووبونێکی زۆر هێناویەتە بەر تیشکی خۆر، ئەو کتێبە هی نووسەری گەورە (کۆنت لیۆ تۆڵستۆ)یە، ڕۆماننوس و ئەخلاقناس و مرۆڤناس و چیرۆکنووس، لەبەر ئەوەی زۆرێك لە زانیان و لیکۆلەرەوانی ئەو سەردەمە بە فەیلەسوفی دەزانن، هەروەها لە چاپە ڕووسیەکە و تەنانەت لە چاپە عەرەبیەکەش کە (سەلیم قوبەعەین) کردویەتی بە عەرەبی لە وەرگێران لە ڕووسیەوە بە فەیلەسوف ناوی تۆڵستۆی هاتووە، ئەوەش مانای هەموو شتێك دەبەخشێت و شایستەی هەڵگرتن ئەو ئالآیەشە، ئالآی فەلسەفەی حەق و حەقیقەت.

ئەو کتێبە کتێبێکی فەلسەفیە ئەوە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە خاوەنەکەی فەیلەسوفێکی زۆر ڕۆچووی ماهییەتی وجوودە، بۆیە داواکارم لە خوێنەری بەڕێز زۆر بە ووردی بیخوێنێتەوە و بیر لە نێوان ووشە و رستە و لە نیەتی نووسەر ووردببێتەوە وهەوڵبدات تێبیگات.

من حەزم بەوەرگێران نیە هەرچەند لە کاتی خۆیدا شتگەلێکی یاسایی زۆرم لە زمانی عەرەبیەوە وەرگێری کوردیم کردووە، بەلآم

لەبەر سەرقاڵیم بە نووسین کاتی وەرگێرانم نیە، بەڵام کاتێك ئەو کتێبەم دەست کەوت کە زۆر تامەزرۆی بەدەست هێنانی بووم کە فەیلەسوفێکی مەسیحی پەردەی حەقیقەت لەسەر ئیسلام و پەیامبەرەکەی هەڵدەداتەوەبریارم دا لە کاتی ئێستا واز لە هەموو خوێندنەوە و نووسینێك بهێنم دەست بە وەرگێرانی ئەو کتێبە بکەم لە زمانی عەرەبیەوە بۆ سەر زمانی کوردی، وەلێ وەرگێرانی ئەو کتێبە هەستێکی زۆر ئەفسووناوی پێبەخشیووم، هەست بە دەسکەوتێکی گەورە و مەزن دەکەم.

زۆر کەس پرسیاری ئەوەم لێدەکات: ئایا تۆلستۆی موسڵمان بووە؟

منیش دەڵیم:

گرنگ نیە موسڵمان بێت یان موسڵمان نەبێت، تۆلستۆی بە شێوەیەکی گشتی لەسەر مرۆڤایەتی و بەرزە رەوشتەکانی پەیامبەر کاری کردووە، تۆلستۆی هەموو حەقیقەتەکانی ریالیزمی لە یەك سەرچاوە دەدۆزێتەوە.

**کارەکانم لەو کتێبە:**

١- تێکستە عەرەبیەکەم وەکو خۆی وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردی بەبێ زیادە خستنە سەر، ئەوەش بۆ ئەوەی تێکستەکانی تۆڵستۆی بە تام و رەنگی خۆی بگاتە دەست خوێنەر، و هزر و بۆچوونی خۆم بەدوور گرتووە لە تێکەڵ کردن بەو کتێبە.

٢-لە چاپە عەرەبیەکەدا وەرگێری عەرەبیکە شتگەلێکی زۆر زیادی خستبووە نێو ئەو کتێبە وەکو (هۆنراوەکەی ئەحمەد شەوقی ئەمیری شاعیرانی عەرەب، کە لە دوایی مردنی تۆلستۆی بۆی نووسیوە) و (هۆنراوەی حافز بەگ ئیبراهیم بۆ تۆڵستۆی) و (پەیامبەر موحەمەد کە ناونیشانێکی نوسینێکی کۆمەلێك نووسەرانی رووسیایین) و (پەیڤەکانی نووسەران دەربارەی ئیسلام، کە باسێکی دوور و درێژە کەوا وەرگێری ڕووسی زیادی کردووە من بە باشم زانی ئەو شتانە لە کتێبەکە بهێنمە دەرەوە بۆ ئەوە خوێنەر تەنیا هزر و نووسینەکانی تۆلستۆی بەر چاو بکەوێت.

٣-داوای لێبووردن لە پەیامبەر و لە پاشان موسڵمانان دەکەم چونکە لە کاتێ تۆڵستۆی باسی پەیامبەر دەکات پاشگری دروودی

خوای لێبێت یان سەلات و سەلامی ئەللای لێبێت نەنووسیوە، منیش لەبەر هەمان فاکتەرەکانی خاڵی پێشووم نەم نووسیووە.

٤-کورتەیەك لە ژیان و کارەکانی (تۆلستۆی)م، لە سەرەتای کتێبەکە باسکردووە بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر ئاشنای نووسەر ببێت.

٥-وەك ئاماژەم پێکرد ئەوە کتێبێکی فەلسەفیە بۆیە لە زۆر جێگا پێویستی بە ڕوون کردنەوە یان شیکردنەوە هەیە بۆ ئەوەی هەموو کەسێك تێیبگات، بەلام من ئەو کارەم نەکرد وادەزانم ئەو کارانەش وەرگێران نیە، بەلکو شرۆڤە کردنە و لە قالب دانی هزر و بۆچوونی نووسەرە.

٦-هەندێك لە فەرمایشتەکانی پەیامبەر لەڕووی ووشەگەرایەوە بە بەراوورد لەگەڵ تێکستە عەرەبیە ڕاستیەکەی کە لە شەش کتێبە فەرموودەکانی پەیامبەر هاتووە یەککگر نیە، بەلام من دەستکاری ئەو تێکستانەی نووسەرم نەکردووە لەبەر راسپاردەی زانستی.

٧-نامەکەی پێشەوا موحەممەد عەبدە کە بۆ تۆلستۆی ناردووە زۆر لام قەشەنگ و پڕ مانا بوو بۆیە وەرم گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی لە بەشێکی تایبەتدا.

٨-لە کۆتایی کتێبەکە کۆمەڵێك وێنەی تۆلستۆیم داناوە بۆ ئەوەی بەردەوام ئەو مرۆڤە گەورەیەمان لەبەرچاوان بێت.

لە کۆتایی داواکارم لە ئەللا ئەو کارەم لێوەربگرێت وەکو دەرخستنی حەق، و هیوادارم ئەو کتێبە کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردی بگرێت.

پارێزەر/ یونس الراوی
١٣/نۆڤەمبەری/٢٠٠٩

## ((لیۆ تۆلستۆی))

## COUNT LEO NILOLAYEVICH،TOLSTOY

(١٩١٠-١٨٢٨)

**ژیانی:**

له (٢٨/ئاب/١٨٢٨) له (یاسنابولیانا) بەشی تولا لە روسیای قەیسەری لەدایك بوو، خانەوادەیەکی دەوڵەمەند باوکی هەڵگری نازناوی کۆنت ودایکی بەشازادە دەناسرا، لەتەمەنی سێ ساڵیدا دایکی دەمرێت وپوری بەخێوی دەکات، پاشان لە ١٨٤١ باوکیشی دەمرێت.

له ١٨٤٤ دەچێتە زانکۆی کازان کۆلیژی زمانەکانی رۆژهەلآت، بەلآم دوای ساڵێك کۆلێژەکەی دەگۆرێت ودەچێتە کۆلێژی ماف وەلێ پێش تەواو کردنی خوێندنی کۆلێژی مافیش جێدەهێڵێت

تۆڵستوی ریگای وانە وخوێندنی لای دلگیر نابێت بۆیە بریار دەدات خۆی خۆی رۆشنبیر بکات ئەوەش لەساڵی ١٨٤٧.

لە ١٨٥١ پەیوەندی بە هێزی سەربازی دەكات وبەشداری چەند شەرێك دەكات پاشان ئەو بەشداریكردنەی وەك ترازیدیای ژیان لەنێو نوسینەكانی ئەدۆزیتەوە بەتایبەتی لە رۆمانی (شەر و ئاشتی) كوێنەیەكی زۆری شەری تیادا بەدی دەكرێت.

دوای خانە نشینی لە خزمەت سەربازیگەشتێك بۆ ئەوروپای رۆژئاوا دەكات لەویا سەرسامی شوێوازی خویندنیان دەبێت پاشان دوای گەرانەوەی بۆ وولاتی دایك ئەو شێواز خوێندنەش لەگەڵ خۆی دەهێنێتەوە بۆ نیشتمانەكەی ئەویش لەرێگای كردنەوە خویندنگایەكی تایبەت بۆ مندالآنی جوتیاران.

گۆڤارێكی پەروەردەی دەردەكات بەناوی (یاسنایا بولیانا) تیایدا هزر وفەلسەفەی پەروەردەی خۆی شرۆڤە دەكات ولەنێو خەلكیش بلأوی دەكردەوە.

لە ١٨٥٤ گەمارۆ بەناو بانگەكەی سیباستبول دەبینێت كاریگەریكی زۆر دەخاتە سەر هزر ونوسینەوەی مرۆڤانێك وەك رشانەوەی نێو قوراوی زستانێكی سارد وسر گوزارشت دەكات.

پاشان دەگەرێتەوە یاسایا بولیانا بۆ ئەوەی ماڵ ومولكە زۆر وفراوانەكەی بەرێوەببات وژیانێكی خۆش بەرێتە سەر وەك هەر دەوڵەمەندێكی تر.

لە ساڵی ١٨٦٠ بۆ دووەم جار گەشتێك بۆ رۆژئاوا دەكات دوای گەڕانەوە رەخنەی توند ئاڕاستەی وڵاتانی ئەورووپا دەكات وبە مادیەت وبێ بەزەیی ونامرۆی وەسفیان لێوە دەكات.

ژیانی هاوسەری لە ١٨٦٢ پێك دەهێنێت پاشان گرنگی بە بەخێوكردنی مەڕ ومالآت ئەدا.

لە ساڵی ١٨٦٥ كۆمەڵی وتار لەگۆڤاری پەیامنێری رووسی بڵاو دەكاتەوە.

تۆلستۆی لەدوا ساڵانی ١٨٦٩ خۆی فێری زمانی یۆنانی دەكات ، پاشان جێماوی سەرانی فەلسەفەی یۆنانی وەك (هێراگلیتس وسوقرات وئەفلاتون وئەرستۆ.......هتد) دەخوێنێتەوە.

لەساڵی ١٩٠١ كڵێسای ئەرسەدۆكسی روسی تەكفیری تۆڵستۆی دەكات، ئەو كارەش لەرێگای بریارێك دەردەچێت بەناوی بریاری كۆمەڵگای پیرۆز. تۆلستۆی وەلآمی ئەو بریارە تەكفیر كردنە بەكتێبێك دەداتەوە لەژێر ناونیشانی (هاوارێك بۆ پیاوی ئاینی) تیایدا بەتوندی هێرش دەكاتە سەر ئەوانەی كە بەناوی خودا بازرگانی بەئاین ورەوشتە بەرزەكانی مرۆڤایەتی دەكەن.

لەكۆتای تەمەنی تۆلستۆی دەگەڕێتەوە نوسینی چیرۆكی فەنتازی ، ژیانیش دوور لەشارەكان بەسادە وساكاری لەگەڵ ئەسپە سپیە بەفرییبەكەی دەگوزەرێنێت.

لە ١٩٠٥ لیۆ تۆلستۆی ئۆپزسیۆنی شۆڕش دەبێت چونكە رایدەگێنێت لەسەر بنچینەی توندو تیژی وساختەكاری بناغەی داكوتراوە ، ورەخنە لە ئەحكامی ئیعدام كردنی بەكۆمەڵ دەگرێت.

لە (٧/تشرینی دووەم/١٩١٠) بەهۆی تووشبونی نەخۆشیەمی سەخت لەقوگیدا گیانی لەدەست ئەدا، لەتەمەنی (٨٢) سالیدا.

دوای مردنی كڵێسای ئەرسەدۆكسی رێگەر بوو لەوەی تەرمی تۆلستۆی بێتە نێو كڵێسا ونوێژی لەسەر بكرێت ونەیانهێشت تەرمەكەی لە گۆرستانی مەسیحیەكان بنێژرێت، ئێستا گۆرەكەی تۆڵستۆی بەتەنیا لە باخێكی ناوچەی (تولا)ی سەر بەشاری مۆسكۆیە.

تۆلستۆی فەیلەسوف و ڕۆماننوس وچیرۆكنوس ڕەخنەگری ڕووسی.

و گەورەترین ئەدیبی مرۆڤایەتی وهەڵبری ئاڵای هزری سۆشیالیستی

تەنانەت هەندێك بەسەركردەی رەوشت وسادەی ناوزەندی دەكەن.

## گرینترین نوسینەکانی تۆلستۆی

١-(حیکمەتەکانی پەیامبەر موحەمەد، وشتێك دەربارەی ئیسلام).

ئەو کتێبەی بەردەستتە.

٢-( شەڕ وئاشتی)

ئەو کتێبە ڕۆمانە، لە دوو بەرگ، ١٨٦٩ نوسیویەتی، زۆرێك لە ئەدەبناسان بەگەورەترین ڕۆمانی دادەنێن تاکو ئەمڕۆش.

٣- (ئاناکارنینا)

ئەو کتێبە ڕۆمانە لە ١٨٧٨نوسیویەتی، وێنەیەکی ریالیزمی ژیانی ڕووسیاییەکی ئەو سەردەمانەن کە تۆلستۆی تیایدا ژیاوە.

٤- مرۆڤ و ژیان.

٥- مرۆڤ بەچی دەژی؟./چیرۆك.

٦- سێ پرسیار./چیرۆك.

٧- ئاغا وخزمەتکار./چیرۆك.

٨- پێویست بوو ئاگرەکە هەر بەپروشکی خۆی بکوژێتەوە./ چیرۆك.

٩- شانسی پەروەردگار لە ناختە.

هزری رەوشت بەرزی بـەرگریكار خامۆشـی تونـد رەوی دەكـات. ئەو كتێبە زۆرترین كاریگەری هەبوو لەسەر رابەری شۆرشی هینـدی (ماتماهاند غاندی)، و (مارتن لۆسەر كینج) لەبـەرگریكردنیان لـەنێو سیاسەتی بەرگریكاری دژی توند وتیژی ، هاندەر بوو بەرەو ئاشتی وئاشتی خوازی.

١٠- منالّی. ١٨٥٢

١١- هەرزەكاری. ١٨٥٤

١٢- گەنج. ١٨٥٧

١٣- قەوقاز

لە ١٨٦٣ نوسیویەتی، باس لە ئەزمونی خۆی دەكات لـە جـەنگ كاتێك وەكو جەنگاوەرێك دەژییت.

١٤- هونەر چیە؟

پێویستە هونەر ڕینیشاندەری رەوشتە بالأكان بێت، وباشتر وایە سادە وساكار بێت، وگوفتوگۆی خەلكی گشتی بكات.

١٥- مردنی ئیڤان ئیلیشت.

نوسیویەتی لە ١٨٨٦ چیرۆكێكی فەنتازییە.

١٦- هێزی تاریكی./١٨٨٨/شانۆنامە.

١٧- چیرۆكی شەیتان./١٨٨٩

١٨- زیندو بونەوە./١٨٩٩/ چیرۆك.

١٩- کریوتز سوناتا/ ١٨٩١.

٢٠- حاجی موراد.

قولآیی زانیاری دەروونناسی تۆلستۆی دەردەکەوێت، ولێهاتووی نوسینی ئیستاتیکای ئەدەبی نوسەر دەسەلمێنێت.

٢١- ئەلبێر./١٨٥٩.

٢٢- دان پیادانان./ ١٨٧٩.

٢٣- کلێــــسا ودەولــــەت./١٨٨١.سیــــستەمی کۆمەلآیــــەتی وچەوساندنەوەی خەلك.

٢٤_ کورتەی ئینجیل./١٨٨٣.

٢٥- رۆژی دوایی./ ١٩٠٠.

٢٦- رەخنە شکسبیر و شانۆگەری./ ١٩٠٣.

## ( حیکمەتەکانی پەیامبەر موحەمەد )

عەبدوڵلا سەهرەوەردی لە هیندستان کتێبێکی ووتەکانی پەیامبەری ئیسلامی نووسیەوە بۆئەم پەرتوکەی ناونیشانێکی هەلبژارد کە ئایەتێکی قورئانە کەکتێبی پیرۆزی موسوڵمانانە ئایەتەکە دەڵێت:

( يريدون ليكفئوا نورالله بأفواههم ويأبى الله إلا أن يتم نوره ولو كره الكافرون ) ئایەتی ٨ لەسورەتی ( الصف ).

واتە : ( دەیانەوێ رووناکی ئەڵلا بەفووی دەمیان بکوژێننەوە، ئەڵلاش بەلێنی داوە کە رووناکیەکەی تەواو بکات با بێ باوەرانیش دڵ گران بن ).

ئەو ووتانەی پەیامبەر کە لەم پەیامە باسم کردووە لە پەرتوو کەکەی عەبدوڵلا سەهرەوەردی سوودم وەرگرتووە.

دەمەوێت ئەوە بڵێم کە ئاینی ئیسلام ناکۆك نیە لەگەڵ رێنمایی سەرجەم ئاینەکانی تر کەوا رێنیشاندەرن بۆ حەق و حەقیقەت و فەرمان بەچاکەو نکۆلی لە خراپە دەکەن.

## موحەمەد کێ بوو ؟

موحەمەد دامەزرێنەر و پەیامبەری ئاینی ئیسلامە، کەباوەرداران و شوێنکەوتوانی لە هەموو گۆی زەوی بەربلاون کەزیاتر لەملیارێك کەس دەبن.

پەیامبەر موحەمەد لەناوچەی عەرەب نشینەکان لەدایك بوو سالی (٥٧٠)ی زاینی. لەدایك و باوکێکی هەژار، سەرەتای ژیانی شوان بوو لەشاری مەککە، لەمنداڵیەوە ئارەزووی بەتەنیای دەکرد لەدەرەوەی شارو شوێنە چۆلەکان تیایدا رامانی دەکرد لە ئەللاّ، لەوساتە عەرەبەکان خەریکی پەرستنی سێ سەدو شەست بت بوون کەوا جۆرەها قوربانیان پێشکەش دەکردن تەنانەت مرۆڤیشیان دەکردە قوربانی بۆ خودا کانیان، لەگەڵ بەرو پێش چوونی تەمەنی موحەمەد بروای زیاتر دەبوو کە خوداکانی نەتەوەکەی ئاینێکی درۆ و هەلەن بەلکو خودایەکی تاك و تەنها و حەق هەیە کەخودای هەموو نەتەوەکانە.

ئەم بڕوایە پەرەی سەند لەدەروونی مووحەمەد تاکو هەلساو نەتەوەو خەلکی بانگەشەی ئەم بڕوایەی کرد کە ڕۆچوو بو لەدلّیدا ئەم هۆکارە ناوەکیە پالنەری بوو، موحەمەد خەلکی ئاگادار کردەوە کەئەللا ئەوی هەلّبژاردووە وەك پەیامبەر بۆ ئەوەی نەتەوەکەی ئامۆژگاری بکا و خوداش سروشی کردووە کە ئاینە درۆینەکەی قورەیش بروخێنێ و چاویان ڕۆشەن بکاتەوە بە حەق و حەقیقەت، ئەم پەیمانەی بانگی خەلکی کرد بەپێی ئەم سروشەی بۆی دابەزی و بەو باوەرە قوولّەی خۆیەوە.

بەکورتی ئەم ئایینەی کە موحەمەد بانگەشەی بۆ دەکرد بریتی یە لەوەی ئەللا تاك و تەنیایە و هیچ خودایەك نیە جگە لەئەلّلا نەبێت، و درووست نیە خودایەکی تر پەرستش بکرێت، و ئەللا بەزەیی و دادپەروەرە، و چارەنووسی کۆتایی مرۆڤ بە خودی خۆی یەوە پەیوەستە.ئەگەر مرۆڤ لەسەر شەریعەتی ئەللا بڕوات و سەرجەم فەرمانەکانی ئەو بەجێ بهێنێت و نافەرمانی ئەللاش

ئەکات ئەوکات لە ژیانی دوایی واتە رۆژی دوایی پاداشت دەکرێت بە پاداشتێکی یەکجار زۆر، وەلێ ئەگەر دژی شەریعەتی ئەللا هەڵسوکەوت بکا، و لەسەر هەواو نەفس بروات ئەوا لەرۆژی دوایی بەسزایەکی بەتین سزا دەدرێت. و هەموو شتێك لە دونیا فانیە لەناو دەچێت و نامێنێ، تەنیا ئەللا دەمێنێتەوە.

بەبێ بڕوایی بە خودا وجێ بەجێ نەکردن فەرمایشتەکانی ژیانێکی ڕاست و دروست لەئارادانیە.

ئەللا فەرمانی داوە کەخەلکی خۆشبوێن و یەکتریان خۆش بوێت، و خۆشەویستی ئەللا لە نوێژدایە، و خۆشەویستی خەلك بۆیەکتری لەرێگەی بەشداری خۆشی و ناخۆشی یەکتر کردن و یارمەتی دان و لێبووردن لە هەڵە، ئەو ساتە دێتە دی.

ئەوانەی بڕوادارن بەخودا و رۆژی دوایی پێویستە هەوڵ بدەن بۆ دوور کەوتنەوە لەهەموو ئەو شتانەی شەهووەتی دەروونی و لەززەتی زەوی پارێزگاربن، وپێویستە لەسەریان کەوابن، و بەلکو پێویستە خزمەتی رۆح بکەن و زێدەرەوی لە خواردن وخواردنەوە

نەکەن و حەرامە لەسەر باوەرداران کەوا مادە هۆشبەرەکان و مەشروباتی رۆحی بخۆنەوە، پێویستە خەریکی کاری چاك و بەرێك و پێکی ئەنجامدانی بن.

موحەمەد نەیگوتوە من تەنیا پەیامبەری ئەللآمو تەواو، بەڵکو باوەری هێناوە بەپەیامبەرایەتی مووسا و مەسیح و گوتویەتی جولەکە و مەسیحیەکان نابێت زۆریان لێبکرێت کەواز لەئاینەکانیان بهێنن، بەڵکو پێویستە لەسەریان وەسیەت و فەرمایشی پەیامبەرەکانیان تەواو بکەن.

لەسەرەتای بانگەشەکردنی بۆ ئیسلام موحەمەد تووشی زۆرێك لەتەنگ و چەڵەمەو گرفت هات لەلایەن خاوەن کتێبە ئاسمانیەکانەوە، بەلآم ئەم ئێش و ئازارەش لەپێش تووشی زۆرێك لەپەیامبەرانی پێش خۆی هاتووە کاتێ نەتەوەکەیان بانگی رێی ئەللآ کردووە، ئەم ئازاردانەی موحەمەد نەبووە هۆی لاواز بوونی یا

وازهێنانی بەڵکو بوە هۆی بەهێز بوون و سوور تر بوونی لەسەر تەواو کردنی گەیاندنی پەیامەکەی.

عەرەبەکان زۆر نایاب بوون لەرووی خۆ بەکەم زانین و خۆ دوور گرتن لە لەززەتی دونیا لەگەڵ برا باوەڕدارەکانیان و کاریان خۆشەویستی و قەناعەتیشان زۆر پێبوو وە ڕەنجی خۆیان سەرەف دەکرد لەپێناو یارمەتی دانی برا باوەڕدارەکانیان لەکاتی تووش بوونیان بەگیرو گرفت.

کاتێکی زۆر تێنەپەری بەسەر هەوڵەکانی پەیامبەر، تا وای لێهات بەرۆیشتنی کات خەڵکان دەوریان لێدان و ریزیان لێگرتن و بە بەرزی دەیانروانین بۆیە رۆژ بەرۆژ ژمارەی باوەڕداران بە مووحومەد وپەیامە ئاسمانیەکەی زیادی دەکرد.

بەلاّم قارەمان و ئازاکان لەهاوەلاّنی پەیامبەر بەچاوی توورەیی سەیری بت پەرست و گەندەڵەکانیان دەکرد، بۆیە زیاتر هەوڵ کۆششیان خستە گەڕ بۆ بانگەشە کردن بۆ ئاینی ئیسلام، و دانپیانان بە یەکتا پەرستی ئەللا، و لەگەڵ ئەوەشدا هاوەلاّنی

پەیامبەر خوێنی ئەوانیان حەللاڵ نەکرد بۆ بەدەست هێنانی ماڵ و سامان یان شتگەلێ لە مەلەززاتەکانی دونیا، ئەوە لەلایەك لەلایەکی ترەوە سەر شۆری و خۆ بەکەم زانینیان قبول نەبوو بەرامبەر ئەو کەسانەی کەوا سوور بوون لەسەر مانەوەیان بەگومڕایی.

ئەگەر بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام بەشێوە فراوانەکەی لەسەر دەستی هاوەڵانی پەیامبەر بۆ هەندێك لە بوزاییەکان و مەسیحیەکانی دڵگیر نەکردبێت ئەوا ئەو ڕاستیە ناشارێتەوە کە موسولمانان لەسەرەتای بڵاو بوونەوەیان بەزوهد و پاکی ژیاننامەدا و خۆپارێزی و بەردەوام بوون لەسەر کاری چاك، تا خەلکان و نەتەوەکانی دەورووبەریان سەرسام بوون لەو کەرەم و ئەخلاق و خۆ نەرم نواندن و پاراستنی سپاردە.

لەپایەکانی ئیسلام شوێنکەوتوانی فەرمان دەکات کەوا باشی بنوێنن لەگەڵ مەسیحیەکان و جولەکەکان، بەتایبەتی لەسەرەتای

دەسەلآت و فەرمانی کردن، مامەڵەکردن و هەڵس و کەوت کردن بەجوانترین شێوە و ڕێزگرتن هەتاکو ئیسلام ڕێگەی دا شوێنکەوتووانی ژنی مەسیحی یا جولەکە بخوازن و ڕێگەشی بە ژنەکانیشیان دا لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوە ئەم شتانە ناشاردرێتەوە لەڕووناکبیران کەوا چ ئیسلام ئاسانکاریەکی ئەنجام داوە.

گومان لەوەنیە کە پەیامبەر موحەمەد یەکێکە لەگەورەترین چاکخوازان کەوا خزمەتێکی زۆر مەزن و لەبیر نەچوونەوەی پێشکەش بەدەستەی کۆمەلآیەتی کردووە شانازی ئەوەی بەسە کەوا نەتەوەیەکی ڕێنمویی کرد بۆ ڕووناکی حەق وای کرد کەوا بالْ بۆ ئاشتی و ئارامی رابخەن و ژیانی زوهد پلەدارتر بکەن و قەدەغەی ڕشتنی خوێن و قەدەغەی قوربانی مرۆڤی وەك قوربانی بکات و ڕێگای مەدەنیەتی بەڕووی ئەم نەتەوە کردەوە ئەوەش کارێکی زۆر مەزنە تەنیا کەسێك دەتوانێت پێ هەلسێت کە هێزێکی پێدرابێت و پیاوێکی وەك موحەمەد شایستەی ڕێز و بەخششە.

## ( پەیڤەکانی پەیامبەر )

- خودایە خۆشویستی خۆت و کەسێکم پێببەخشی کە خۆشەویستیەکەی سوودی تۆم پێ بگەیەنێت.
- حەق بڵێ، با تاڵیش بێت.
- براکەت سەربخە باستەمکار، یان ستەم لێکراو بێت. پیاوێك ووتی: سەری دەخەم لەکاتی کەستەم لێکراو بێت بەلاّم چۆن سەریبخەم کاتێ ستەم کاربێت؟

پەیامبەر ووتی : رێگربە کەستەم بکا، ئەوە سەرخستنی تۆیە بۆ براکەت.

- ئەللاّ لەسەر زمانی پەیامبەر دەڵێ :

کەسێك چاکەیەك بکات، من بە دە یان زیاتر پاداشتی دەدەم وکەسێك خراپەیەك بکات، یەك جار سزای دەدەم یان لێیخۆش دەبم، کەسێك بستێك لێم نزیك بێتەوە شەقاوێك لێی نزیك دەبمەوە کەسێك شەقاوێك لێم نزیك بێتەوە زیاتر لێی نزیك دەبمەوە کەسێك

بەڕێشتن بۆم بێت بەغاردان بۆی دەچم، وکەسێك بەقەد هەموو زەوی گوناه بکا، پاشان هاوبەشیم بۆنەکا، لەڕۆژی دوایی بەقەد زەوی لێبوردن و بەزەیی پێدەبەخشم.

- خودایە بەهەژاری بم ژێینە، و بەهەژاری بم مرێنە، و لەگەڵ کۆمەڵانی هەژاران حەشرم بکە.
- بڕوایی هیچ یەکێکتان تەواو نیە تا ئەوەی بۆ خۆی خۆشی دەوێ بۆ براکەی خۆش بوێ.
- بەهەشت لە ژێر پێی دایکەکانە.
- حەلال ئاشکرایە، و حەرامیش ئاشکرایە.
- بەزەیی بکەن لەگەڵ ئەوانەی سەرزەوی بەزەیی دەبێ ئەوەی لەئاسمانە، لەگەڵتان.
- پیاوێك پرسی چ ئیسلامێك باشە ؟

پەیامبەر ووتی : خواردن ببەخشێ و سڵاو بکات لەو کەسەی دەیناسێ و لەوەی نای ناسێت.

- دڵەکانتان مەمرێنن بەزۆری خواردن و خواردنەوە.
- خودا لەسەر زمانی پەیامبەر دەڵێت :

خەزێنەیەکی شاراوەبووم، وویستم بزانم، ئەفریندراوەکانم ئافراند، پاشان منیان ناسی.

- باشترین خێرکردن چاککردنەوەی نێوان خەڵك و پاراستنی زمانە.
- هەر ژنێك خۆی بۆندار بکات، پاشان دەربچێت بۆدەرەوە و بەلای هەرکەسێك بروات بۆئەوەی بۆنی بکەن، ئەو ژنە داوێن پیس هەژمار دەکرێت، و هەموو چاکەکانی بەزینا دەنووسرێت.
- دانیشتن لەگەڵ کەسێکی باش چاکترە لە تەنیایی و تەنیا باشترە بەبەراورد لەگەڵ دانیشتن لەگەڵ کەسێکی خراپ، و قسەی چاك باشترە لە بێدەنگی و بێدەنگی باشترە لە قسەی خراپ.
- زینای چاو سەیر کردنی شتی حەرامە، و زینای دەروونیش هیواو ئاواتە خوازی شتی خراپە.
- ئەوەی تورەبوونی خۆی کپ بکاتەوە، لەکاتێك لە توانای داهەبێت توورە بوونەکەی بەکار بهێنێت و لەدەستی بێت، ئەوا ئەڵلا دڵی ئەو کەسە پڕ دەکا لە ئارامی و باوەڕ.
- گۆڕ یەکەم مەنزلگایە لە مەنزلگاکانی رۆژی دوایی. باشترین جیهاد ئەو کەسەی جیهادی دەروونی خۆی بکا لە پێناو خودی ئەڵلا دا.

- ئەگەر پیاو چووە ناو نوێژەوەو ئەوە ئەڵڵا بەرامبەری دەوەستێت.
- ئەڵڵا حەزدەكات بەندەكانی ببینێت كەبەدوای پەیدا كردنی رۆزی حەڵاڵن.
- ئەوەی ئارام لەسەر نەخۆشی و ژێر دەستی بگرێت، ئەڵڵا قەرەبووی دەكاتەوە.
- زریانی ژێر چوونی ئایین سێ شتە :-

زانایەكی لە ئایین دەرچوو، و پێشەوایەكی ستەم كار، و موجتەهیدێكی نەزان.

- دونیا لەززەتە، و باشترین لەززەتی دوونیا ژنی باش و پارێزگارە.
- درۆكردن دوور كەوتنەوەیە لە باوەڕ.
- شتەكان ببەستەوە لە شوێنی خۆی، ئینجا پشت بەخودا ببەستە.
- هیچ پەرستش كردنێكی ئەڵڵا ناگاتە بیركردنەوە.
- خۆشەویستیت بۆشتێك كوێر و كەڕت دەكات.

- باوەری هیچ مرۆڤێك تەواو نابێت تا ئەو شتەی بۆخۆی پێی خۆشە بۆ براكەشی پێی خۆش بێت.
- باشترین ووشە كەدركابێت (لەبید)ی شاعیر ووتویەتی: هەمووشتێك بێجگە لە ئەللا پوچەڵە.
- ئایا هەواڵی باشتر كردەوەیەكتان پێبدەم لە بەرۆژ بوون و نوێژ خوێندن و شت بەخشین:-

ووتیان: بەڵێ ئەی نێردراوی ئەللا.

فەرمووی:- لەپێناو ئەللا خەڵك ئاشت و چاك بكەنەوە.

- یەكەم ئەفریندراو كەئەللا ئافراندی ( عەقل) بوو پاشان پێی گووت: بەرەو ڕووبە، بەرەو ڕوو بوو، پاشان ووتی: پشت بكە، پشتی كرد.

ئەللا ووتی سوێند بە مەزنی و شكۆمەندی خۆم هیچ ئەفریندراوێكم وەك ئەم ئافریندەیە خۆشەویست نیە لەلای من وەكو

تۆ، لەبەر تۆ وەردەگرم، لەبەر خاتری تۆ دەبەخشم، بەهۆی تۆ پاداشت دەکەم، بەهۆی تۆش سزاش دەدەم.

- ئازا ئەو کەسە نیە کەزوو ململانێ هەڵگیرسێنێ، وەلێ ئازا ئەو کەسەیە کە خودی خۆی ڕاگیر بکا، لەکاتی تووڕە بووندا.
- ڕازیبە بەوەی کە ئەڵلاّ بۆی بەش کردووی، دەبیتە دەوڵەمەنترین خەڵك.
- عومەری کوڕی خەتاب چووە ماڵی پەیامبەر، بینی پەیامبەر لەسەر حەسیرێك پاڵ کەوتووە کەلەسەر جەستەی جێماوی حەسیرەکەی تیا دەرچوو بوو.

ووتی: پەیامبەری خودا بۆچی فەرشێك ناهێنی لەجیاتی ئەم حەسیرە، ئەی تۆ گەورەی هەموو جیهان نیت؟

پەیامبەر بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی :- من چیم لە دونیا، وێنەی من لەگەڵ وێنەی دونیا، وەك سوارێك بەرێگاوە لەهاوینێکی گەرم بۆ ساتێك دادەبەزێتە ژێر سایەی درەختێك بۆ چەند ساتێك لە ڕۆژدا پاشان شوێنەکەی جێدە هێلێت و دەڕوات.

- دوو تایبەتمەندی هەیە، لەهەر کەسێك بێتە جێ ئەڵلا بە سوپاس گوزار و ئارامیان دەنووسێت:

ئەو کەسەی سەیری ئاینی کەسی لەخۆی بەرزتر بکات، پاشان دوای دەکەوێت.

ئەو کەسەی سەیری دنیای لەخۆی نزم تر دەکات، پاشان ستایشی ئەڵلآ دەکا لەسەر ئەوەی پلەی لەو بەرزتر کردووە.

- پیاوێك هاتە لای پەیامبەر سەلامی خوای لێبێت ووتی: من خۆشتم دەوێی، پەیامبەر فەرمووی سەیرکە چی دەلێیت ؟ ووتی: سوێند بەئەڵلا خۆشتم دەوێ ( سێ جار دووبارەی کردەوە)، پەیامبەر ووتی ئەگەر ڕاست دەبێژی چاو لەو کردار وهزرانەم بکە کە وایلێکردوویت خۆشمت بوێت.
- ئەگەر ویستت باسی خەڵك بە خراپە بکەیت، بیر لە خراپەکانی خۆت بکەرەوە بۆئەوەی بتگەرێنیتەوە لەباسکردنی خراپەکانی خەلك.

- میلێك هەنگاو بنێ بۆ سەردانی نەخۆش، دوو میل هەنگاو بنێ بۆ چاك کردنەوەی نێوان دووکەس، ئازار و شت لەسەر رێگا لابەرە بەچاکە بۆت دەنووسرێت.
- پارێزگاری بکە، هیچ چاکەیەك بەکەم مەزانە با بەتاڵ کردنی گۆزەیەك لەقاپی ئاو بارانیش بێت، یان بە پێکەنینەوە بە برای ئاینیت بگەییت، و نەکەی جل و بەرگت لە ژێر پێت یان لە دوات بخشێت، چونکە جل درێژی لە خۆ بەگەورە زانینە، ئەڵڵاش ئەم کارەی خۆ ناوێت.

ئەگەر کەسێك قسەی پیس و ناشرینی کرد دەربارەی سیفەتێك کە هەتە، تۆ ناشرینی مەکە بەو سیفەتەی کەهەیەتی، بەڵکو لێگەڕێ خۆی و رێگای خۆی، پاداشتیش بۆ تۆیە، جوێنیش بەهیچ کەس مەدە.

هەرکەس ستەم لە کرێکارێك بکات و کرێی پێنەبەخشێت، ئەڵڵا کردەوە باشەکانی پوچەڵ دەکاتەوە، و بۆنی بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات.

## ( نزای پەیامبەر )

- ئەی زیندووی نەمر، هیچ خودایەك نیە جگە لە تۆ نەبێت، بە سۆزی تۆ پەنا دەگرم، لەگوناهەکانم ببورە، کارەکانم چالاك وچاك بکە، دڵتەنگیەکانم لابەرە بەدلۆڤانی خۆت.
- لێم خۆش ببە چونکە کەسێك ناتوانێت لەگوناهی مەزن خۆش بێت تەنها خودایەکی مەزن نەبێ، پاسەوانیم بە چاوەکانت لێ بکە کەهەرگیز ناخەون.، پارێزیم لێ بکە بەو کوچەیەی کە نارمێت، میهرەبانیم لەگەڵ دەسەلاتت لەسەرم بنوێنە، تۆ هیوای منی، چەندێك لەناز و نیعمەتەکانت پێت بەخشیوم کە سوپاس گوزاریم کەم بۆ کردوویت، وچەندێ بەڵات بۆمن ناوەتەوە ئارامیم کەم گرتووە، ئەی ئەوەی کە چاك سازیەکانت تەواو نابێت، ئەی خاوەن ئەو نیعمەتانەی کە نا هێنرێنە ژمار، رزگارم بکە لەوەی تیایدام، یارمەتی دەرم بە لەوەی بەسەریەوەم لەوەی کە ناردووتە خوار لەبەر خاتری روخساری بەخشندەت.
- پەیامبەر بە کۆمەڵێك لەهاوەڵان و شوێنکەوتوانی فەرموو (وەرن پەیمان بدەن کە هاوەڵ بۆ ئەڵلا نەنێنەوە، و دزی نەکەن و داوێن پیسی نەکەن، و منالەکانتان نەکوژن و قسە بە دەمی کەس هەڵنەبەستن لە ژێر دەست و پێیەکانتان، و نا فەرمانیم نەکەن

لەکاری چاکە، هەرکەسێك وەفای هەبێت بەرامبەر بەم پەیمانەی ئەڵلا پاداشتی تەواوی دەداتەوە.

- ڕۆژگارێ دێت هیچ شتێك لەئیسلام نامێنێ تەنیا ناوەکەی دەمێنێ، و ئایین نامێنێ تەنیا سومبلەکانی دەمێنێتەوە، بەخشندەی لەدڵەکان دەردەچێت و ڕۆزی حەلاڵ کەم دەبێت و حەرام زۆر دەبێت.
- لەڕاستیدا ژنان هاوشانی پیاوانن.
- زانستێك کە سوود مەند نەبێت، وەکو خەزنەیەك کە نەبەخشرێت.
- لەئەخلاقی باوەردار بەدەرە، دەست پانکردنەوەو ئێرەیی بردن، تەنیا لە داواکردنی زانست نەبێ.
- ئەڵلا ئاسمانی بەسێ شت ڕازاندەوە : خۆر و مانگو ئەستێرەکان.

زەویشی ئارایش کرد بەسێ شت : زانایان و باران و دەسەلاتداری دادپەروەر.

زانست پێشەوایە، کاریش شوێنکەوتوویەتی، بەختەوەران وەری دەگرن و بێ بەختانیش لێی بێبەشن.

- کاتێك زانایەك لەدوونیا دەردەچێت وەکو ئەوە وایە کە چرایەك لەماڵێکی تاریك دیەچێتە دەرەوە.

- خودا گیان نەمکەیتە بەلاو گرفت، تەنانەت بۆ دوژمنکانیشم.
- ئەڵڵای بەرزو شکۆمەند رۆژی دوایی دەفەرموێ : ئەی کوڕی ئادەم نەخۆش کەوتم سەردانت نەکردم : دەڵێ چۆن سەردانت بکەم کاتێ تۆ خودای هەموو جیهانی، دەفەرموێ ئەی نەتزانی فلان نەخۆش کەوت سەردانت نەکرد، ئەگەر سەردانت بکردبوایە منت لای ئەو دەدۆزیەوە، ئەی کوڕی ئادەم داوای خواردنم لێکردی پێت نەبەخشیم : دەڵێ چۆن خواردنت پێ بدەم لەکاتێ تۆ خودای هەموو جیهانی، دەفەرموێ ئەی نەتزانی فلان بەندەی من داوای خواردنی لێکردی پێت نەدا خۆ ئەگەر پێت ببەخشیایە لای من دەستت دەکەوت. ئەی کوڕی ئادەم داوای ئاوم لێکردی تۆش نەت دامێ : دەڵێ چۆن ئاوت پێبدەم لەکاتێ تۆ خودای هەموو جیهانی، دەفەرموێ بەندەی من فلان داوای ئاوی لێکردی تۆش نەت دایێ، نەت زانی ئەگەر پێت بدابا ئەمرۆ لای من دەستت دەکەوت.

کار بۆ دونیات بکە وەکو ئەوەی تا هەتا ئەژییت، و کار بۆ رۆژی دوایت بکە وەك ئەوەی بەیانی دەمریت.

- ئەوەی درۆ بکات گوناە بار دەبێت، ئەوەی گوناە بار بێت لەئایین دەردەچێت، ئەوەی لە ئایین بچێتە دەر دەچێتە دۆزەخ.

## "مرۆڤ و ژیان"

موحەمەد پەیامبەری ئیسلام هەڵسا بەکارێکی زۆر مەزن ئەویش رێنموی کردنی بت پەرستان،ئەوانەی هەموو ژیانیان لەشەڕی ناوەخۆی و ڕژاندنی خوێنی مرۆڤ ڕابورد کردبوو، موحەمەد رێنشاندەر بوو بۆ کۆتای هێنان لەنەریتی قوربانیکردنی مرۆڤ بۆ بتەکان.

موحەمەد ئەللآی تاك وتەنیای پێناساندن، چاوەکانیانی بە ڕوناکی باوەڕ رۆشەن کردن.

ئەوەی ویستی لێکۆڵینەوەی ئەوەی هەیە، کە ئایا ئیسلام ئاسانکاری یان بارگرانی مرۆڤی کردووە؟ پێویستە قورئان بخوێنێتەوە لە مانا ووشەکان ڕامان بکات، لەنێوان وپشت دێرەکان بڕوانێت.

ئەو کتێبەی موحەمەد هێنای یەکگری زۆری تێدایە کە تیشك دەخاتە سەر رۆحی شکۆمەندی ئیسلام، لەئایەتێکی قورئان هاتوە:

(واعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا واذكروا نعمه الله عليكم إذ كنتم أعداو فألف بين قلوبكم فأصبحتم بنعمته إخوانا وكنتم على

**شفا حفره من النار فأنقژکم منها کڤلك یـبین الله لکم ئایاتـه لعلکم تهتدون) ئایه ١٠٣ سوره ئال عمران.**

(هەمووتان دەست بەپەیمانی ئەللاوە بگرن ولێـك جیـا مەبنـەوە ونـازی ئـەللا بخەنـەوە هۆشـتان لـەکاتێك دوژمنـی یـەکتر بـوون پەروەردگار دڵکاننتانی یەکخست بەنازی ئەو برایـەتیتان هاتـە بـوون ئێـوە لەسـەر لێـواری هەڵـدێری ئـاگردابوون بـەو شـێوەیە ئـەللا بەڵگەکانی ڕوون دەکاتەوە بەڵکو ڕێگای ڕاست بگرن).

من یەکێکم لە سەرمەستان بە پەیامبەر موحەمەد کە ئەللای تاك وتەنیا هەڵیبژارد بۆ ئەوەی کۆتا پـەیام لەسـەر دەسـتی ئـەو بـلاوە بکات، ئەویش ببێتە دوا پەیامبەر.

شـەریعەتی قورئـان ڕۆژگـاریێ سەرانسەری جیهـان دەگرێتـەوە، چونکە لەگەڵێ عەقڵێ وحیکمەت یەکگرو گونجاوە.

## ( پەیامی پێشەوا موحەمەد عەبدە )

خـوالێی خـۆش بێـت پێـشەوا و زانـا شـێخ موحەمـەد عەبـدۆ پەیامێکی بۆ فەیلەسوف تۆلستۆی نووسی لەبەر گرنگی ئەو پەیامە لەم کتێبەش هاتووە.

ئەی حەکیمی پایە بڵند......تۆلستۆی :

شانـسی ناسـینتمان پـێ نەبەخـشرا بـەڵام بـێ بـەش نـەکراین لەناسـین لەگـەڵ رۆحـت، ئـەوەش لەسـەر مانـەوە روونـاکی هـزرت دەرکـەوت، دەرکـەوت لـە هزرمـان خۆرەکـانی تیورەکانـت، خۆشەویستیت ناوەتە نێو عەقلمەندان و دەروونت.

ئـەڵڵا رێنمـایی مەعریفـەی سروشـتی کـردووی ئـەو سروشـتەی خـەلکی تیـادا ئافرانـدووە، راگـیری کـردووی بەسـەر ئامانجێـك کـە مرۆڤەکان بەدواوەین.

گەیـشتی بـەوەی کـە مـرۆڤ هاتۆتـە ئـەم وجـوودە بـۆ ئـەوەی بەزانـست بـروا بـەڕێگا و بـەروبوم بگـرێ بـەکارکردن تـاوەکو بەروبومەکەی ماندوو بوون بێت بۆئەوە دەروون بحەسێتەوە.

هەستت بە بەلأکردوە کە دێتە خواری مرۆڤەکان کاتێك لەرێگەی پاکی لادەدەن بەوەی بەکاردەهێن هێزەکانیان کەنەیان بەخشیوە بۆئەوەی بەختەوەربن پشوویان نەماوە ئارامیان لێ براوە.

سەیر لێکردنی سەیری ئایینت کرد کەوا پەردەی چاولێکردنت پچراند، بەهۆیەوە گەیشتیە ڕاستیەکانی یەکتایی خودا و دەنگت بەرزکرد بانگی خەلك بکەی بۆ ئەوەی کەخودا ڕێی ڕاستی نیشانداویت.

هەنگاوت لەپێشیانەوە هەلگرتووە بەکارکردن بۆ ئەوەی چاوت لێبکەن بەقسەکانت عەقلەکانت ڕێنمایی کرد و بەکردەوەکانت ماندەری بالأی و شکۆمەندی بوویت.

هەروەك چۆن بۆ چوونەکانت ڕووناکی بووە سەر لێشێواوان پێی ڕینموی بوون، نموونەشت لە کارکردن پێشەوا بوون ڕێگا بەرەکان شوێن پێت کەوتوو بوون هەروەك چۆن وجوودیەکەت هۆشداری خودا بووە بۆ دەولەمەندان ئاواش درێژ کردنەوەی بۆ دەستدرێژی لاوازو هەژاران بووە.

بەرزترین شکۆمەند بەزمانیەوە و گەورەترین پاداشت دەستت کەوتوە لەسەر ماندوو بوونەکانت لە ئامۆژگاری و رێنیشاندان ئەوەیە کەبێ ئاگایان ناویان ناوە بێ بەش و دورکەوتنەوە.

ئەوەی سەرانی ئاین ئەنجامیان دا دژ بەتۆ هیچ رووداوێك نیە جگە لە اعترافیان رایانگەیاند بۆ خەلك کە تۆ لەنەتەوەی سەرلێشێواوان نیت، ستایشی ئەللا بکە لەوەی کە جێمان هێشت بە قسەکانت هەروەك تۆ جێتهێشتن لە بڕواو کردەوەکانیان.

لەگەڵ ئەوەش ئاواتە خوازین کەدەروونمان نوێ ببێتەوە بە مۆزەی پێنووسەکەت لەداهاتووی رۆژانی تەمەنت ئێمەش داواکارین لە ئەللا کەتەمەن درێژت بکا و هێزەکانت بپارێزێت و دەرگای دڵەکان بکاتەوە بۆ تێگەیشتن لە قسەکانت و دەروونەکان هاژووشت بکا بۆ چاولێکردنت لە کارو کردەوەکانت، سەلامت لێ بێت.

برات

موحەمەد عەبدە

– رێنمایەکانی موحەمەد حیکمەتگەرایەکی باڵاَن، وئامۆژگاری زۆر پێویستی ژیانن، مرۆڤ بەرەو رێگای ڕاست رێنموی دەکات.

–شەریعەتی قورئان ڕۆژگاریَ سەرانسەری جیهان دەگرێتەوە، چونکە لەگەڵ عەقلَ وحیکمەت یەککگر وگونجاوە.

– تەنیا ئاینێك وجودی هەیە، باوەڕی ڕاستگۆیانە وانازانم هەڵەم لەو شتە کردبێت

# ناوەڕۆك